زنجیره توێشوی بانگخوازان: ٣٨



# تورە مەبە


دانانی

د. عومەر عەبدولکافی

وەرگێڕانی

حاجی عەبدولجەلیل

# پێناسەی کتێب

ناوی کتێب: توڕە مەبە

بابەت: پەروەردەی ئیمانی

نوسەری: د. عمر عبدالکافی

وەرگێڕانی: حاجی عبدالجلیل

پێداچونەوەی: م. مەلا فتحی زراری.

تایپ ونەخشەسازی وبەرگ: زیلان عبد الجلیل

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

نۆردی چاپ: چاپی یەکەم ٢٠٠٨ز-١٤٢٩ك

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (١٨٠٥) ساڵی (٢٠٠٨)ی دراوەتێ

کتێبخانەی مەحوی

ناونیشان/ هەولێر - بەرانبەر قەڵات - بازاری ڕۆشنبیری- تەنیشت تاپۆ

تەلەفۆن/ ٠٦٦٢٢٢٣٦٥٠

# بەناوی خوای گەورە ومیهرەبان

سوپاس وستایش بۆ ئەو خودایەی کە قورئانی بەسەر بەندەکەی خۆی دابەزاندووە، وهیچ نارێکی یەکی تیا نەکردوە، پاکی وبێ گەردی هەر بۆ ئەو خوایە وبانگخوازی ڕاستیش هەر بۆ ئەوە کە بە تەنگەودیە ومژدە پێ بەخشینی واجب وپێویست کردوە: ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ ال عمران: ١٠٤.

واتە: پێویستە لە ئێوە کۆمەڵێك پێك بێت یان با هەمووتان ئومەتێك بن کە بانگخوازای بکەن بۆ چاکە وفەرمان بکەن بە هەموو کارێکی دروست وباو وقەدەغەی هەموو نادروستیەکان بکەن ئا ئەوانە سەرفرازن. "ت.ئاسان"

شایەدی دەدەم کە (الله) تاکە وهیچ هاوبەشی نیە وبەلگەی داناوە وتەواو ڕاستەرێی کردوە. ﴿وَيَأْبَى اللّهُ إِلاَّ أَن يُتِمَّ نُورَهُ وَلَو كَرِهَ الْكَافِرُونَ﴾ التوبە: ٣٢.

واتە: خوا ناهێلێت ئاواتیان بێتە دی، هیچی دیکەی ناوێت بێجگە لەوەی ئایین ونوری خۆی سەر باخات، وتەواو دیار بکات وهەرچەندە گاور وکافرەکان پێی سەخڵەت بن ودڵ تەنگ بن. "ت.ئاسان"

شایەدی دەدەم کە سەروەر وخۆشەویستمان محەمەد ﷺ نێردراوی خوایە: هەروەها پەیام وڕاسپاردەکەی گەیاندوتە جێ وئامۆژگاری خەڵکی کردوە، وتەم ومژی لاداوە، هەتا ڕۆژی کۆچی دوای بۆ خوا تێ کۆشاوە، خوایە گیان تۆش درودی خۆت وصەڵاواتی لەسەر لێ بدە، هەروەها وێڕای کەسوکار وهاوەڵان وهاوسەر وشوێنکەوتوانی کە باوەڕیان پێی هێناوە وباوەڕیان بە

ستەمکاری دانەپۆشیوە وبەڕاستی ئەوان دڵنەوایی وهیدایەتی خودایان بووە.

ئیدی:ئەی برای موسڵمان، توڕە بوون خوێکی ئینسانیە لە ناخی هەموو نەوەی ئادەم ڕەگی هەیە، بەڵام بە شێوەی جیا، ئەمە ڕێچکەیەکی ئاسایی مرۆڤە وخەڵکان دەیگرنە بەر، بەڵام قەبارەی جیا وشێوەی جیای هەیە کە هەموو کەس وەکو یەك نین.

بۆچی پێغەمبەر ﷺ نەفرەتی لە توڕە بوون کردووە؟ بەو کەسی داوای ئامۆژگاری لێکرد فەرمووی: توڕە مەبە، توڕە مەبە، توڕە مەبە، سێ جار فەرموویەتی.

ئایا هەموو شێوە وجۆرەکانی توڕە بوون زەمکراون نەفرەت لێ کراوان؟ ئایا مرۆڤ هەرگیز توڕە نابێ، ئایا موسڵمان بە هیچ جۆرێك نازانێ توڕە بوون چی یە؟ ئایا هیچ توڕە بوونێك هەیە خوا خۆشی بووێ، یان

توڕه بوونیش هەیە کە خوای بەندەکان وپێغەمبەرەکەی ﷺ ڕقیان لێیەتی؟

ئایا خۆشەویستمان ﷺ توڕه دەبوو؟ ئەوەندە بە ڕەحم وبەزەیی بوو کە خوای گەورە دەربارەی ﴿بالمؤمنين رؤف الرحيم﴾ دەفەرمووێ: ﴿وأنك لعلى خلق عظيم﴾ القلم: ٤.

گفتگۆی یە دەربارەی ئەمە دەکەین، لەم چەند لاپەڕەیە لەسەری دەدوێین، داوا کارم لە خوای گەورە ئێمە وئێوە لەگەرمی توڕه بوون دورخاتەوە وبمانگێڕێ لەو کەسانەی کە نەرم ونیانن، وە لەو کەسانە بین کە توڕه بووین بۆ خوا وپێغەمبەرەکەی ﷺ تووڕە بین، خوای جیهانیان قبولی بکەی.

توڕه بوونێك هەیە پەسندە وتوڕه بونێکیش بێزراوە، بەلاَم پێوەر چیە بۆ ئەوەی لێکیان جیا بکەینەوە؟

بێگومان بەڕاستی فەرهەنگی ڕدوشتەکان پێغەمبەری خوای ﷺ، چۆن بۆ زمان فەرهەنگمان هەیە کە دەتوانی بە هۆیەوە بگەڕێیتەوە سەر بنچینەی ووشە وبابەتە وماناکەی، یان ئەو پێودرانەی کەوا قورسایی وپێوانە ودرێژایی پێ پێوانە دەکەین، ئاواش بەرز کەرەوە وقاموس وپێوەری خۆڕەوشت کەسایەتی گەورەمان وخۆشەویستمان محەمەدی هەڵبژێردراوە ﷺ.

وەرن با شوێن ژیانی محەمەد ﷺ بکەوین لەماوەی (٢٣)ی ساڵی پێغەمبەرایەتی، بزانین کەی توڕە دەبوو؟ بۆت ئاشکرا دەبێ هەرگیز لەسەر خۆی توڕە نەبووە... هەرگیز، هەرگیزبۆ خۆی توڕە نەبووە، بەڵام ئێمە لەبەر خۆمان توڕە دەبین، واتە ئەگەر دیتت سنورێك لە سنورەکانی خوا دەبەزێندرێت، دوو کارت لە پێشە: ئەگەر بڕواداریکی ڕاستەقینە بی ئەوە توڕە دەبی،

ئەگەر مرۆڤێکی دوور لەخوای گەورەش بی ئەوە هیچ گرنگیەکی پیٚ نادەی، بەلاٚم ئەگەر باوکت لە کەدار بکەن وجویٚن بە دایکت بدەن وباسی ناموست بکەن هەلدەچی دەبیٚ یان بیٚدەنگ دەبی.

وەرە با هەندیٚك نموونەی پیٚغەمبەر ﷺ باس بکەین کە تیٚدا تورە بووە: هەمووومان بەسەرهاتی ئەو ئافرەتە مەخزومیەمان لەبەرە کە دزی کرد بوو، بەنی مەخزوم هاتنە لای ئوسامەی کوری زەید کە خۆشەویستی پیٚغەمبەر ﷺ، واتە ئەو گەنجەی کە پیٚغەمبەری خوا ﷺ زۆری خۆشدەویست، گوتیان ئەی ئوسامە تکامان بۆ بکە لای پیٚغەمبەری خوا ﷺ، چونکە ئەو ەئافرەتە مەخزومیە لە پایەو پلەیەکی بەرزی هۆزەکەی بوو، لە ماقولانی هۆزەکە بووبەنی مەخزوم وا گومانیان دەبرد کارەکان هەروەکو پیٚش ئەوەی (أقرأ) هاتیە دەروا، هەستیان نەکرد ونەیانزانی پاش (أقرأ) جیهان هەمووی

گۆڕاوە، لەو کاتەی ئوسامە تکای بۆ ژنەی مەخزومی لەلای تکاکار ﷺ کرد، خۆشەویست ﷺ تورەیی لە نێو چاوانی بەدیار کەوت، هاوەڵان ئەگەر ئارەقی خەشمیان[1] بدیبایە دەیانزانی پێغەمبەر ﷺ لەو پەڕی تورەیی دایە.

جا بەسەر مینبەر کەوت وفەرمووی: بەڕاستی ئەوەی میللەتانی پێش ئێوەی لە ناو برد، ئەگەر کەسێکی ناودار دزی کردبا لێ ی دەگەڕان، وئەگەر کەسێکی بێ هێزیش دزی بکردبا ئەوە حەددیان لێ دەردەکرد. سوێند بەوەی گیانی محەمەدی ﷺ بەدەستە ئەگەر فاتمەی کچی محەمەد دزی بکات دەستی دەبڕم، پاشان ڕووی لە ئوسامە ولە هەموویان کرد وفەرمووی: ئایا تکا دەکەی لە سنورێك لە سنورەکانی خوا ئەی ئوسامە؟

---

١ جۆرە ئارەقەیەك بوو لە نێو چاوانی خۆشەویست ﷺ تا دەگەیشتە نێوان چاوەکانی.

پێغەمبەر ﷺ لە تۆڵەی مافی مرۆڤەکان زۆر سەیر تورە دەبوو، هەر بۆیە کاتێك هەندێك لە موسڵمانانی نوێ هاتنە ناو ڕەشماڵی پیاوێکی دەشتەکی لە دەرەوەی شاری کە بە هۆی سەفەرەوە ماندوو ببوون، پیاوی خاوەن ڕەشمالیش مەڕەکانی لە ژێر سێبەر ڕاگرتبوو، چونکە نیوەڕۆیان پلەی گەرمی بەرز دەبێتەوە.

ئەمانە چوونە لای ئەعرابی وپێیان گوت: بەرخێکمان لۆ بنێرە لەو بەرخانە، دەشتەکیش هەر خۆیان سەخی تەبیعەتن، واتە ناڵێن بەچەند پێمان دەفرۆشی، چونکە ئەمە لای عەرەب تاوانە پێ ی بڵێ ی بە چەند ئەمەم پێ دەفرۆشی؟ جا بەرخەکەیان برد وسۆریان کردەوە وخواردیان، پاشان گوتیان: ئەی ئەعرابی (پیاوی دەشتەکی) لێمان گەڕێ لە ژێر ئەم سێبەرە بین ومەڕەکانیش دەرکە، ئەعرابیش گوتی: ئەمە لە دەیان

یەکی بۆ منە، ئەگەر بچنە بەر ڕۆژێ ئەوەی ناو زگیان دێتە دەرێ، گوتیان: نا، ئێمە بە نرخترین لەم مەڕانە.
مەڕەکانیان دەرکرد وخۆیان لە ژێر سیبەری ڕەشماڵ لێ ڕاکشان، پاشان کەمێك مەڕەکانی خوێنیان لەبەر ڕۆیشت وبەچکەی ناو زگیان لەبار چوو، هەموو ووردی دابەزی، ئەعرابی مێگەلی بەجێ هێشت وچوود (مەدینە) وشکایەت وسکالای حالی خۆی لای پێغەمبەری خوا ﷺ کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من پیاوێکم خوای گەورە ڕێنموویی کردم بە ئیسلام ونیعمەتی لەگەڵ کردووم، ئەم چینە خەڵکەش دەڵێن ئێمە هاوەڵین وهاتوونە ئاواو ئاوایان پێ کردووم.
پێغەمبەر ﷺ چاوەڕێی کرد تا هاتنەوە،[٢] لێی پرسین: ئایا ئێوە ئاواتان کردووە؟ گوتیان: نەخێر، هەموویان

---

[٢] ئەمە کارێکی گرنگە، کاتێك تۆ گوێ لە کچەکەت دەگری دەربارەی مێردەکەی دەربارەی ڕووداوێك چاوەڕێ بکە تا مێردەکەی دێتەوە، یان

لەسەر درۆ ڕێککەوتن، کە نۆ کەس بوون، پێغەمبەریش ﷺ نزیك بوو باوەڕیان پێ بکات چونکە ئەویش مرۆڤە.

ئەعرابی گوتی: سوێند بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاست دەڵێم و ئەوانیش درۆ دەکەن، داوا لە خوای گەورە دەکەم کە قورئان ئێستا دابەزێ، تا ڕاستگۆیی من ودرۆی ئەوان دەربخات،[٢] پێغەمبەر ﷺ پرسیارەکەی دووبارە کردەوە، گوتیان: ئەعرابی ڕاست دەڵێ... ئەعرابی ڕاست دەکا، ڕەنگی پێغەمبەر ﷺ گۆڕا وتوڕە بوو، فەرمووی: بەڕاستی ئیماندار درۆ ناکات تەنها لە

---

گوی لە ڕووداوێك دەگری لە کوڕەکەت دەربارەی خێزانەکەی چاوەڕی کە تا خێزانەکەی ئامادە دەبێ، پێویستە هەردوو لا ئامادە بن تاکو بڕیار بدەی.

[٢] واتە ئەعرابی دەیەوێ ئاسمان بهەژێ لەبەر مێگەلە مەڕێك، سەیری پەیوەندی بەندە بکە لەو کاتەی نیەتی پاکە لەگەل خوای پاك وبێگەرد.

سێ شوێن نەبێ: نێوان دوو کەس چاك بکات، درۆ لەگەڵ ژنەکەی بکات بۆ ئەوەی نێوانیان چاك بێت، ودرۆش چونکە لە جەنگدا فێل وچەواشەکاری تێیدا دروستە.

ئەم سێ شوێنە دروستە موسڵمان درۆیی تێدا بکات، بەلاّم بێجگە لەم سێ شوێنە بەهیچ جۆرێك دروست نیە.

پێغەمبەر ﷺ تورە بوو ومێگەلێك مەڕی لە مێگەلەکەی خۆی دایەوە، وئەعرابیش هەر دەیگوت: ڕاستی فەرمووە ئەوەی ناوی لە تۆ ناوە بەسۆز وبە زەیی وبە ڕەحم.

ئەمە تورە بوونی پێغەمبەرە ﷺ، چونکە لەسەر درۆ کۆ بوونەوە، چونکە ستەمیان لە ئەعرابی کرد بوو، چونکە خراپەیان لەگەڵ چاکە کار کرد بوو، سەیری تورەیی بکە لەو کاتەی پێویستە مرۆڤ تێدا تورە بێت.

'سەیری مرۆڤایەتی ﷺ بکە وەکو مێردێك، ئەی مێردەکان سەیری نموونەی مێردایەتی ڕاست بکەن لە خۆشەویستمان محەمەد ﷺ، لە حەجی ماڵئاوایی هەموو خێزانەکانی لەگەڵدا بوو، ئەنجەشەش یەکێك بوو لە سوار چاکی ووشترەکان، لە پێشەوەی هەموو ووشترەکان گۆرانی دەگوتەوە، ووشترەکان گورج وگۆل دەڕۆیشتن وکەل وپەلەکان دایکی ئیمانداران دەلەقانەوە، پێغەمبەریش ﷺ ئەنجەشەی هێمن دەکردەوە ودەیفەرموو: نەرم ونیان بە لەگەڵ شوشەکان ئەی ئەنجەشە.

ووشتری سەفیەی کچی حویەی کوڕی ئەختەب ماندوو ببوو ونەیتوانی لە ڕێگاکە بڕوات لەگەڵ ئەوەی باشترین ووشتری لا بوو، سەفیەش زۆر بە کوڵ دەگریا، ئەم هەواڵە گەیشتە پێغەمبەر ﷺ فرمێسکی سەفیەی بە

دەستەکانی دەسڕیەوە، توخوا چەند جار فرمێسکی خێزانەکەت سڕیوەتەوە؟

هەر جارەی پێغەمبەر ﷺ فرمێسکەکانی دەسڕی زیاتر دەگریا، ئەمە سروشتی ئافرەتە، سەیری بوخاری بکە ئەم بەسەرهاتەمان بۆ دەگێڕێتەوە، ئەم دیمەنە جوانەی کە مرۆڤایەتی ماندوو بوو لەو کاتەوەی لەبیری چووە کە چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئافرەتەکانی وەکو مێرد وباوك دەژیا، بەڵێ هەر جارەی فرمێسکەکانی دەسڕی یەوە بە زیاتر دەگریا، و پێغەمبەری خوا ﷺ بە جێی هێشت، چونکە سەرکردەی جەیشە وپێغەمبەری بانگخوازە بەر پرسە و ئەم گریانە ئەم هەمووە ناهێنێ، لەو کاتەی لێی تورە بوو وازی لێ هێنا تاکو کڕ بێتەوە، سەفیە زۆر غەمبار بوو، ترسا ئەگەر قسەی لەگەڵ بکات زیاتر تورە بێت بۆیە کڕ بوو. سەفیە چووە لای عائیشە ڕەزای خوا لە هەموویان بێت

وگوتی: ئەی عائیشە، هەرگیز ڕازی نابم شەوی خۆمت بدەمێ تەنیا ئەگەر پێغەمبەرم ﷺ بۆ ڕازی بکەی ئەوە شەوی خۆمت دەدەمێ.

سەیری ڕێز بەندی مانەوەی خێزانەکانی بکە "ماشاء الله" ڕێزبەندی وبیرکردنەوە، هەر کەس وا گومان دەبا ژنان عەقلیان نیە، سەیری ڕێز بەندی بکە، دەزانی لە کوێ یە کلیلی کردنەوەی کەسایەتی پێغەمبەری خواﷺ، ئەگەر تۆ شارەزا بی بە کچەکەت وپێش هاوسەرگیری پێت گوت: ئەی کچەکەم، بزانە لە کوێ یە کلیلی کردنەوەی دڵی مێردەکەت چونکە بۆ خۆی ومێردەکەی خێر وچاکە دەستە بەر دەکات.

سەفیە گوتی: ئەی عائیشە ئەگەر پێغەمبەری خوات ﷺ لەبری من پێ ڕازی کرا ئەوە ئەو شەوەی من بۆ خۆت، عائیشە دەڵێ چوومە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی عائیشە ئەمە شەوی تۆ نیە؟ گوتی ئەی

پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاستی سەفیە هەڵەی کرد چونکە لەبەر دەستی تۆ زۆر گریا، بەڕاستی سەفیە... بەڕاستی سەفیە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕازی بوو، وهێمن بۆوە، پاشان بەزەینەبی ڕەزای خوای لێبێ فەرمووە کە سێ ووشتری لا بوو: ئەی زەینەب ووشترێك بدە سەفیەی خوشکت، گوتی: ووشترێك بدەمە ئەم جولەکەیە؟ پێغەمبەر ﷺ یەك مانگ لە زەینەب توڕە بوو، قسەشی لەگەڵ نەکرد تا ڕازی کرد پێغەمبەری خواش لێی بووری.

سەفیەش کاتێك ئەم قسەیەی پێ گەیشت گوتی: پێی بڵێن: ئەگەر من کچی یەهودیەك بم، ئەوە باوکم هارونە ومامیشم موسایە ومێردەکەشم محەمەدە ﷺ.

پێغەمبەر ﷺ توڕە دەبوو ئەگەر کەسێك هەڵەی بەرامبەر کەسێکی تر بکردبا یان سنورێکی دیاری کراوی ببەزاندبایە، کەواتە ئەمە توڕە بوونی چاك

وپەسندە: بۆ خوا تورە بی، بەلاّم ئاگادار بە، پێویستە لەم کاتە بە جوانی هەڵی وکەوت بکەی، نەکەی هەڵە بزر بکەی، وزیان لە ئیسلام بدەی لە باتی ئەوەی سوودی پێ بگەینی!! بەلاّم تورە بوونی خراپ ئەوەیە بۆ خۆت تورەبی، لەبەر خاتری خۆت تورە بی، وراستی بزر بکەی.

برای ئیسلام: ئایا ئەگەر لە ژنەکەت تورە بووی بە ووشەیەك ئاشت دەبیتەوە؟ یان سنوری خۆت رادەوەستی؟ ئەگەر تورە بووی، چاری چیە؟ دەست نوێژ بشۆ، خۆت پەنا بدە بەخوا لە گەرمی وئاگری تورەیی، حالت دەگۆڕێ، ئەگەر دانشتبووی هەستەوە، ئەگەر پالکەوتووی دانیشە، وئەگەر لە ماڵیش بووی برۆ دەرەوە، ئەگەر دەتەوێ ئاگری تورەیی بکوژێتەوە، تورەیی لە شەیتانە وشەیتانیش لە ئاگر وئاگریش بە

ئاو دەكوژێتەوە —دەست نوێژ ئەو كات خوای گەورە لە توڕەییت دوو دەخاتەوە.
توڕەیی پەسند ئەوەیە لەبەر خوا توڕە بی وتوڕەیی ناپەسند ئەوەیە لەبەر خۆت وخاتری خۆت توڕە بی.
توڕەیی چیمان لێ دەكات؟
توڕەیی وا لە مرۆڤ دەكات لە كۆتایی هەر هەلبچی وهەڵە بكات، كاتێك توڕە دەبی دەتەوێ قسەكەی دوور لە ڕاستی بكەی چونكە دەتەوێ خۆت سەركەوی، تاكو كارەكە دەگاتە لای هەندێك لە باوكان ودەڵێن: سوێند بەخوا نزیكە كوڕەكەم لە میرات بێ بەش بكەم، ئەگەر مردم بە دوای ئەو كچەم مەنێرن، چونكە نامەوێ نە بە زندوێتی نە بە مردووی بیبینم.
بەڵی توڕەیی سەر كیشی مرۆڤ دەكات بەرە و هیلاكەت وگومڕایی، سەرەڕۆیی منداڵ وای لێ ناكات كە بێ بەش بێ لە میرات، بەڵكو سەرەڕۆیی لای خوا وای لێدەكات لە

دونیا منداڵی سەرەڕۆیی ببێ، وکچی لاسارو هەلگەڕاوە نەوەی خراپی دەبێ.

بەلاّم من وەکو باوکێك ئەگەر بینیم کوڕەکەم گویرِایەڵیم ناکات بۆم دروست نیە بێ بەشی بکەم لەو حەقەی هەیەتی لە میرات.

هەروەکو لەم زەمانە تێبینی دەکەین کە منداڵەکانمان لە حاڵێکی تورِەیی وهەلگەڕاوەیین، سەد دیناری دەدێی دوو سەدی دەوێ، هەزاری دەدێی دوو هەزاری دەوێ، وای لێهاتووە دەریا دەخواتەوە وئەم خواردنەوەش هیچ شتێکی زیاد ناکات تەنها تێنوێتی نەبێ.

کەی منداڵ ڕازی دەبن؟ ئەو کاتەی خۆراکی حەلاّڵمان پێ دان، ئەگەر دوعای خێرمان بۆ کردن، وبۆیان پێشەنگ بووین، ئەگەر بۆیان پێشەنگێکی باش بووین، لەو کاتەدا ئەگەر دیتی باوکی ڕێزی دایکی دەگرێ، ئەگەر کچ بینی دایکی ڕێزی باوکی دەگرێ وبە گەورەی

دەزانی، ئەو کاتە مندالّەکانمان لە تورِەیی دوور دەبن، من لە مامۆستام دەویٚ تورِە نەبیٚ، با وادانیٚ هەموو پۆل و هەموو قوتابخانە مندالّەکانی خۆیەتی، با مامۆستای زانکۆ وا دابنی ئیٚمە مندالّەکانمان ناردووە تا فیٚریان بکەن وبۆیان ببنە پیٚشەنگ، تۆش ئەی پزیشك بۆچی لە نەخۆش تورِە دەبی؟ نەخۆش لەبەر حالّەتیٚکی خەراپ هاتووە، خاو وخیٚزانی چاوەرِیٚی دەم وچاوی تۆ دەکەن، زەردەخەنەت بۆ ئەوان یەکسانە بە هەموو دونیا، ببە هاورِیٚی، وبە بەزەیی بە، وبەرِەحم بە.

تۆ کاکی فەرمانبەر لەبەر چی لە سەردانیکاران تورِە دەبی؟ ئەگەر کەسیٚك بە کەم وکورِیەو هات، بە جوانی ورِوو خۆشی یەوە پیٚی بلّیٚ: ئەمە کەم وکورِیتە وتیٚی بگەینە، ئەگەر ئەو برات بوو وهاتە لات، یان بەریٚوە بەرەکەت داوای لیٚ کردی، یان وەزیر لەرانبەرت دانیشت بوو ئەو کاتە چ دەکەی!!

برای ئیسلام، بەم نەرم ونیانیە هەڵسوكەوت لەگەڵ خەڵكی بكە ولەكەس تورە مەبە، تۆ ئەی ڕۆلەی خۆشەویست لە دایك وباوكت تورە مەبە بەڵكو هەموو شەوێك ڕازیان بكە، با هیچ دایك وباوكێكیش نەخەوێ تاكو لە منداڵەكانی ڕازی نەبێ (گەردەنی خۆتی پێیان ئازاد بكە).

ئەی هاوسێ لە هاوسێكەت تورە مەبە، ئەی مرۆڤی موسڵمان وەكو هەنگ بە: ئەگەر خواردت پاك بخۆ، وئەگەر خواردنیشت دا بە كەسێك خواردنی پاكی بدێ، وئەگەر لەسەر گوڵێكیش وەستای تێكی مەدە ومەیشكێنە، موسڵمانیش ئەوهایە لاسار وڕەزا قورس وخوێن سارد نیە، بەڵكو خوێن شیرینە، وسوك وچروك وزمان پیس وزمان درێژ وتورە ودەمارگیر نیە. (داوا لەخوا دەكەین كە جوانترین خۆڕەوشتمان پێ ببەخشێ).

جا ئایا تورەیی پەسند وتورەیی ناپەسند ماناى چیە؟

تورەیی ناپەسند ئەو تورەی یە کە هەمووومان دەیزانین: تورە دەبی ئەگەر کەسێك سەرپێچی کردی، واتە: ئەگەر فەرمانت بە کەسێك کرد کە حەقت لەسەر هەیە ولە ژێر فەرمانی تۆیە ئەوجا چ کور یان خێزان بێ یان فەرمانبەرێك کە لە ژێر دەستت دایە، بەرێوەبەری نوسینگەکەت، سکرتێری هەر کارێك، کەواتە تۆ زۆربەی حەقەکانت بەفیرۆدا.

بە ئەعرابیەکان گوت: هەزار ووشترت دەدەمینێ ئەگەر بتوانی مەعنی کوری زائدە تورە بکەی، کە نەرم ونیانترین کەسی عەرەب بوو، کابرای ئەعرابی رۆیشت وپرسی: مەعن کێ یە؟ دەیویست لە رەوشتی ئەو پیاوە بزانێ، پێیان گوت: نەرم ونیانترین کەسی عەرەبە وکەس ناتوانیج تورەی بکات، ئەمە پێشەوای کوری

پێشەوایە ودەوڵەمەندە وشەرفمەندە وپلەبەرزی کوڕی پیاو ماقولانە.

ئەعرابی شارەزایی ژیانی مەعنی کوڕی زائدە بوو، بەڵکو ژیاننامەی وەرگرت، بەرخێکی سەر بڕی وپێستەکەی بەرواژی لەبەر کرد —توکەکەی لە ژێرەوە وخوێن وخیزاوەکەش لە سەرەوە- هاتە لای مەعن وخۆی فڕێ دایە سەر تەختەی شانشینی ولە تەنیشتی لێی دانیشت.

مەعنی کوڕی زائد کەمێك لە ئەعرابی دوور کەوتەوە تاکو بە خوێن وپیسی نەبێ، ئەعرابیش هەر خۆی لێ نزیك دەکردووەوە، تا گەیشتە ئاخیری تەختەکە وخۆی پێوە نوساند، وئەعرابی بە چاوێکی سوك سەیری

مەعنی کرد وگوتی: بە بیرت دێ کە کراسەکەت پێستێکی بێ قیمەت وپێلاوەکەت لە پێستی ووشتر بوو.[٤] مەعن پێکەنی وگوتی: بە بیرم دێ وهەرگیز لە بیری ناکەم، لەگەڵ ئەوەی مەعن هەرگیز پێستەی لەبەر نەکرد بوو. ئەعرابی پێی گوت: پاکی بۆ ئەو خوایەی کە ماڵێکی زۆری پێ بەخشیوی وفێری دانیشتنی لەسەرە خۆی سەر تەختی شانشینی کردووی. مەعن زەردەخەنەکی کرد وگوتی: ئەوە بە فەزلی خوایە نەك فەزلی تۆ، ئەعرابی پێی گوت: فەرمان بکە بۆم ئەی کوڕی ناکەس بەچە بە هەندێك پارە چونکە سورم لەسەر پیشەی خۆم، بەڕاستی ئەمە لەکەدار کردنێکی زۆر گەورە بوو لای عەرەبەکان.

---

[٤] واتە: ئەی مەعن ڕۆژانی فەقیر وبێ نەوایت بە بیر دێت کە تۆ وماڵ ومنداڵەکەت تێیدا بوون، مەعنیش ئەو پیاوە دەوڵەمەندە بوو تێری کوڕی تێران بوو.

بەڵام مەعن گوتی: دەی هەزار دیناری بدەنێ!! مەعن تورە نەبوو!! ئەعرابی گوتی: ئەمە کەمە و لەوە زیاترم وبەرچاو تێرم، مەعن گوتی: دوو هەزاری بدەنێ، هەزار بۆ ئەوەی داوای کرد وهەزاریش شوکرانەی خوا لەسەر ئەوەی سەبرمان گرت لەگەڵیدا.

بەڵام تورەیی پەسند وباش ئەوەیە تەنها بۆ خوا تورە بیت، تورە ببی چونکە کچەکەت خۆی پۆشتە نەکردیە (بەڵام ئەم بابەتە بە لێزانی وئامۆژگاری چاك چارەسەر بکە)، تورە ببی چونکە خوشکت پارێزگاری ناکات ولەخوا ناترسێ، تورە ببی چونکە ئامۆزاکەت پیاوێکی ستەمکارە، تورە ببی چونکە بەرپرسێکی نزیکت لە خوای گەورە ناترسێ لەبەرپرسیاریەتی، ئەمانە تورە بونێکی پەسندن، بەڵام تورە بوونی ناپەسند وئەوەیە لەسەر خۆت تورە بی، لەسەر کاروباری دونیا.

برای ئیسلام:ئەم هەفتەیە خۆت وا ڕابێنە کە تورە نەبی، بەیانی هاوار دەکری دەڵێی: بەڵێن دەدەم کە ئەم هەفتەیە تورە نەبم(انشا الله تعالی)، تاکو دەوروبەرت واهەست دەکەن کە تۆ بەتەواوی گۆڕاوی، واگومان مەبە بەم حاڵە شەیتان وازت لێبێنێ، بەلاّم ئەمەش جۆرێکە لە جیهادکردن. لە کۆتایش دا ئامۆژگاریم بۆ هەمووتان، بۆ هەموو برایەك کە ئەم پەیامە دەخوێنێتەوە ئەودیە : تورە مەبە ، تورە مەبە، تورەمەبە

الحمد للة رب العالمین

بەهاری ٢٠٠٨

هەولێر

# له نوسراو و وەرگێڕدراوەکانی نوسەر کە چاپ کراون ئەمانەن:

١- بەسەر هاتی تۆبەکاران

٢- چاکسازی دڵان

٣- پەروەردەی ڕۆڵەکان وئاسودەیی خێزان

٤- توێشوی بانگخوازان کە چل ﴿٤٠﴾ دانە نامیلکەیە:

١-پەیامێك بۆ کچانی زانکۆ.

٢- تا ببیتە بەختەوەرترین کەس.

٣- دادگای دادپەروەری.

٤-چۆن دەبیتە موسڵمان؟

٥- چۆن ورە بەرز دەکەی؟

٦- خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ

٧- نەخۆشیەکانی دڵان.

٨- شەمەندەفەری ڕۆژگار

٩-ئیسلام بەبێ ئاینزا.

١٠- ژیر وبێ ئاگا.

١١- لە نهێنیەکانی قورئان.

١٢- ترس وتکا.

١٣- لێبوردەیی.

١٤- سەلیقە.

١٥-بەروبومەکانی گوێڕایەلی.

١٦- بەروبوومەکانی زیکر.

١٧- سوپاسگوزاری ونزا.

١٨- پەینی بەختەوەری.

١٩- دڵپاکەکان.

٢٠- چارەسەری ڕك وحەسودی.

٢١- نزاو نوێژ.

٢٢- زیکری ڕاستەقینە.

٢٣- گوێڕایەڵی وسەرپێچی خودا.

٢٤- پەندی مردن.

٢٥- ژیانی دڵان.

٢٦- مردنی دڵان.

٢٧- حیکمەتی تاقیکردنەوەی خودا.

٢٨- هاوسەرگیری سەرکەوتوو.

٢٩- ڕوو وەرگێڕانی خودا لەبەندەی.

٣٠- نەنگی ونهێنیەکان.

٣١- بەربەستەکانی وەرگێرانی خوا پەرستی.

٣٢- پیاوان تەنیا چوار جۆرن.

٣٣- براوە ودۆڕاو.

٣٤- سوپاسگوزاری نیعمەتەکان.

٣٥- کات.

٣٦- لەهەرە پێشەوەی شارەزا بوون بەرپرسیاری یە.

٣٧- زمانی خۆت بگرە.

٣٨- توڕە مەبە.

٣٩- هیوا درێژ.

٤٠- ئایا پیشەکەی خۆت لەبیر چووە؟

دیوانی ﴿سۆزێك بۆ خۆشەویست ﷺ﴾ لە ژێر چاپ دایە.

چاوەڕێی کتێبی حیجامە (کەلە شاخ) بکەن

-بەربەستەکانی وەرگێرانی خوا پەرستیەکان.

-پیاوان تەنیا چوار چینن.

- براوە ودۆڕاو.

- سوپاسگوزاری نیعمەتەکان.

-کات.

-لەهەرە پێشەوەی شارەزا بوون بەرپرسیارێتی یە.

- زمانی خۆت بگرە.

-تورە مەبە.

-هیوا درێژی.

-ئایا پیشەکەی خۆت لەبیر چووە؟